# شەڕی سەیر و سەمەرە

**نووسەر:  مارتین ئاوەر[1]**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)




**ISBN-10:** 3407784368

ڕێبەندانی 2710ی کوردی

**پێرست** **لاپەڕە**

**پێش وته:**

ئەم نووسراوەیە بریتییە لە چەند چیرۆکی کورت بۆ منداڵان و لە کتێبی Der Seltsame Krieg وەرگەڕاوەتە سەر زمانی کوردی. کتێبەکە نووسەرێکی ئوتریشی (نەمساوی) بەناوی "مارتین ئاوەر" تایبەت بۆ منالانی نووسیوە و سەبارەت بە فێرکردن و ڕاهێنانی مرۆڤە بۆ ژیانێکی پڕ لە ئاشتی و دوور لە شەڕ.

نووسەر دەڵێ : <u>"لەو کاتەوە کتێب بۆ منالان دەنووسم، لام زۆر گرینگ بووە بتوانم بابەتە سەرەکییەکان و بەتایبەت **شەڕ** و **ئاشتی** بە زمانێکی ساکاری وا بنووسمەوە کە منالان بەباشی لێی تێ بگەن. بە باوەڕی من تا ئەوجێگەیەی لە تواناماندایە دەبێ هەوڵ بدەین منالان تێبگەیینین کە شەڕ دیاردەیەکی سامناك و ئاشتی شتێکی باشە".</u>

سەرەڕای ئەوەی تەنانەت زۆربەی منالانیش دەزانن کە "**شەڕ**" ترسێنەر و "**ئاشتی**" هێورکەرەوەی ژیانە، ئایا گەیشتن بە ئاشتی گونجاوە؟ ئایا بە هەزاران ساڵ ئەزمونی تاڵی شەڕ کە تا ئەمڕۆش لە زۆربەی بەشەکانی ئەم جیهانە وەك مۆتەکە لەسەر شانمانە، مرۆڤ ناهێنێتە سەر ئەو باوەڕە کە زیاتر بۆ ئاشتی هەوڵ بدات؟ بە بڕوای من ئەوە ئەرکێکی گەورە و مەزنە لەسەر شانی ئێمەی دایك و باوك و هەموو بەشدارانی کۆمەڵگا، کە منالان لە سەرەتاوە وا رابهێنین کە لە داهاتووی ژیانیاندا جیاواز لە هەر بۆچوون و باوەڕێك کە هەیانبێت، بتوانن لە ئاشتی و ئاسوودەییدا لەگەڵ یەکتر بژین و وشەی شەڕ و تووڕەیی بخەنە ناو زبڵدانی مێژووەوە.

بۆ بڵاوکردنەوەی نووسراوەکەی مارتین ئاوەر، ئیمەیلێکم[2] بۆ خۆی نارد و داوای ئیزنی وەرگێڕانی کوردیم لێکرد.

لە ئیمەیلەکەدا نووسیبووم: ماوەیەك لەوەپێش کتێبەکەی ئێوەم خوێندەوە. توانایی ئێوە بۆ نووسینی تەوەری گرینگی وەك "شەڕ" و "ئاشتی" بە زمانی مندالان جێی شانازییە. بەداخەوە مرۆڤ لە دنیای ئێمەدا نایهەوێ حاڵی بێ کە جیاواز لەوەیکە ئێمە چ دین یا بۆچوونێکمان هەیە، دەکرێ

له ئاشتی و تۆلەرانسدا پێکەوە بژین. له ئیمەیلەکەدا باسم کردوە کە لە ئاڵمان دەژیم و هەروەها باسی ماڵپەڕی بۆکان / رۆژهەڵاتم بۆ کردوە. لە کۆتاییدا داوای وەرگێرانی بابەتەکەم لێکردوە.
ئەویش بە دڵفرەوانییەکی زۆرەوە وەڵامی[3] ئیمەیلەکەی دامەوە و تێیدا نووسیبووی: "زۆر سپاس بۆ ئەو نووسینە دۆستانەیە. من زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەگەر ئێوە نووسراوەکەی من وەرگێرنە سەر زمانی کوردی. بە دڵفەراوانییەوە ئیزنی وەرگێرانی داوە و دواتر سپاسی کردوە کە لەو پرۆژەیەدا هاوکاری دەکەم".
لە رێگای وەڵامەکەی نووسەرەوە زانیم کە بەهۆی ئەو نووسراوەیەوە پرۆژەیەك بە ناوی **"کولتووری ئاشتی"** وەرێ کەوتووە کە زۆرێک لە نووسەران و وەرگێرانی وڵاتان پشتیوانی لێدەکەن. تەنانەت ماڵپەرێکی تایبەت بەو پرۆژەیە کراوەتەوە کە ئەوە ئادرەسەکەیەتی:
http://www.peaceculture.net

لێرە بەدواوە، من هەوڵ دەدەم بە پێی توانا بەرە بەرە ئەو بابەتە وەربگێرمە سەر زمانی کوردی و لە هەمان ئەو ماڵپەڕە ئاڵمانییە و هەروەها لە ماڵپەڕی بۆکان/رۆژهەڵات دا بڵاوی بکەمەوە. بەهیوای وەدی هاتنی ئەو ئاواتە بەرزانەی نووسەر و نەک هەر نووسەر بەتەنیا، سەرجەمی مرۆڤایەتی.
لێرەدا جێی خۆیەتی سپاس و دەستخۆشی کاك ئەنوەر سوڵتانی بکەم کە بۆ وەرگێرانی ئەو بابەتە هانی داوم و هەڵەکانی بۆ ڕاست کردوومەتەوە.

نادر فەتحی(شوانە)     ڕێبەندانی 2710ی کوردی

---

1) Martin Auer(1 نووسەری ئەو کتێبە لە ساڵی 1951 لە شاری وینی ئوتریش لە دایك بووە. گرمانیستیك و مێژووی لە زانکۆ خوێندوە.

2) ئەوە دەقی ئیمەیلەکەی منە بۆ نووسەر بە زمانی ئاڵمانی:

Sehr geehrter Herr Martin Auer,

kürzlich habe ich Ihren Text „**Der seltsame Krieg**“ im Internet gelesen. Ihre Fähigkeiten wie Sie mit Kindern über so wichtige Themen wie „Krieg“ und „Frieden“ umgehen, ist zu bewundern. Leider wollen die Menschen in unsere Welt nicht verstehen, dass wir  egal mit welchen Augen unsere Welt auch anschauen mögen, wir nur in Frieden und mit Toleranz miteinander leben können.

Ich lebe seit einigen Jahren in Deutschland und bin kurdischer Abstammung.  Neben meinem alltäglichen Leben, betreibe ich eine Homepage in der kurdischen Sprache. Ich versuche über diesen Weg, unterdrückte kurdische Kinder zu erreichen. Diesen Kindern ist es sogar verboten, ihre Heimatsprache zu erlernen.

Mein Wunsch ist es, diesen Kindern ihre  Geschichten zu vermitteln. Daher würde ich gerne einige ihrer Texte in die kurdische Sprache Übersetzten.

Ich hoffe auf Ihr Verständnis und möchte Sie um eine Genehmigung diesbezüglich bitten.

Mit freundlichem Gruß

Nader Fathibokani

3) ئەوەش دەقی وەڵامی نووسەرە بۆ من:

Guten Tag Nader Fathibokani,

vielen Dank für Ihre freundlichen Worte. Ich freue mich sehr, dass Sie Texte aus "Der seltsame Krieg" ins Kurdische übersetzen wollen und Sie haben selbstverständlich die Genehmigung dazu. Ich bitte Sie nur, die Übersetzungen nicht nur auf Ihrer eigenen Homepage, sondern auch auf http://www.peaceculture.net zu publizieren.

Ich wünsche Ihnen viel Erfolg und danke Ihnen noch einmal für Ihre Mithilfe bei diesem großen Projekt.

Herzliche Grüße

Martin Auer

# خەیاڵاتی

**نووسەر: Martin Auer (مارتین ئاوەر)**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

ڕۆژێك لە ڕۆژان مرۆڤێکی خەیاڵاتی هەبوو. ئەو لەبەر خۆیەوە خەیاڵاتی دەکرد و بۆ وێنە دەیگوت:

بڵێی ئەوە گونجاو نەبێ کە مرۆڤ بتوانێ هەتا سەدهەزار کیلۆمتری پێش خۆی بە چاو ببینێت؟ یا:

بڵێی ئەوە گونجاو نەبێ کە مرۆڤ بتوانێ سوپ بە چەنگاڵ هەڵقوڕێنێ؟

ئەو دەیگوت: خۆ دەبێ ئەوە گونجاو بێت کە مرۆڤ بتوانێ لەسەر سەری خۆی ڕابوەستێ. یا دەیگوت: بڵێی ڕۆژێك نەیێت کە مرۆڤ بتوانێ بە بێ ترس بژی؟

خەڵکی پێیان دەگوت: "ئەو خەیاڵاتە سەیرانەی تۆ دەیکەی قەت وەدی نایەن، تۆ تەنیا خەیاڵاتی و بەس" ئەوان دەیانگوت: تۆ دەبێ چاوەکانت بکەیەوە و دنیای ڕاستەقینە سەیر بکەی و بیسەلمێنی!

ئەوان دەیانگوت: یاسای سروشتی لەم جیهانە هەن و گۆڕانکاریشیان بەسەردا نایە!

بەڵام مرۆڤەکە دەیگوت: من نازانم ... خۆ دەبێ ئەوە گونجاو بێت کە مرۆڤ بتوانێ لەژێر ئاودا هەناسە هەڵکێشێ. یاخود لانیکەم دەبێ ئەوە گونجاو بێت هەموو کەس نانی خواردنی خۆی پێبدرێت. یا دەبێ ئەوە

گونجاو بێت مرۆڤ تەنیا ئەو شتە فێربێت کە پێی خۆشە. دەبێ ئەوە گونجاو بێت کە مرۆڤ بتوانێ ناوەوەی زگی خۆی سەیر بکات.

خەڵکی پێیان دەگوت: ڕۆڵە گیان خۆڕاگر بە! ئەو خەیاڵاتەی تۆ قەت وەدی نایەن. تۆ ناتوانی بڵێی: من دەمهەوێ و ئیتر بە هۆی ویستنی تۆوە هەمووشتێك بە قسەی تۆ بێت. ئەو جیهانە بەو شێوەیەیە کە هەیە و ئیتر بە خەیاڵاتی تۆش هیچ شتێك ناگۆڕدرێت.

کاتێك تەلەفیزیۆن پێکهات، مرۆڤ دەیتوانی سەدهەزار کیلۆمەتر پێشەوەتری خۆی ببینێ و کاتێکیش کەرەسەی پزشکی دروستکرا مرۆڤ دەیتوانی ناوزگی خۆی سەیر بکات.

بەڵام هیچ کەس بەوی نەگوت: "دەی باشە، ڕەنگە حەق بە تۆ بوو‌بێت و بیرەکانت زۆریش خەیاڵاوی نەبوون. یا تەنانەت کاتێك کەرەسەی بن ئاو دروستکرا و بە کەڵك وەرگرتن لەو کەرەسەیە مرۆڤ دەیتوانی بە راحەتی لە ژێر ئاودا هەناسە هەڵکێشێ، کەس هیچی پێ نەگوت.

بەڵام مرۆڤەکە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: زۆر باشە، ڕەنگە رۆژێك بێت کە مرۆڤ بتوانێ بە بێ شەڕ ژیان بەرێتە سەر!

# کوڕێکی شین

**نووسەر: Martin Auer (مارتین ئاوەر)**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

ڕێگایەکی زۆر زۆر دوور لە پشت ئەستێرەکان رەنگە هەمووشتێك جیاوازی هەبێ لەگەڵ ئێرە و لای ئێمە. هەروەها زۆر دوورتر لەوێش جیاوازی هەبێ لەگەڵ ئەوێ، و ئەوێش به تەواوی جیاوازی هەبێ به هەڵسەنگاندن لەگەڵ ئێرە.

بەڵام ئەگەر مرۆڤ ڕێگایەکی زۆر دوورتر بفڕیبایە، زۆر زۆر دوورتر، لەوێ کە هەمووشتێك جیاوازی هەیە لەگەڵ جێگاکانی تر، رەنگە هەمیسان هەمووشتێک وەك لای ئێمە وا بێت.

لەو ڕێگا زۆر زۆر دوورە ڕەنگە گۆیەک هەبێ بە گەورەیی زەوی و لەسەر ئەو گۆیە کۆمەڵێك مرۆڤ بژین کە تەواو لە ئێمە بچن بەڵام بەو جیاوازییەی کە ڕەنگی ئەوان شین بێت و توانایی ئەوەیان هەبێ کە گۆێچکە کانیان کپ کەن کاتێك پێیان خۆش نەبێ گوێ لە شتێك ڕاگرن.

لەو رێگا دوورە و لەسەر ئەو گۆ زۆر دوورە، ڕەنگە جارێك شەڕێکی گەورە و مەزن بەڕێوەچووبێ و زۆرێك لەو مرۆڤە شینانە مردبێتن و زۆر مندالّی چکوولە بە تەنیا و بێ دایك و باوك مابێتنەوە.

لەسەر تەپۆڵکی خانوبەریەکی خاپوورکراو بە هۆی بۆمباوە، کوڕێکی شین دانیشتووە و بۆ دایك و باوکی دەگری. جارێکیان یەکجار زۆر لەوێ دانیشت و گریا، بەڵام لەپڕێکدا ئیتر نەگریا، چونکە هەموو فرمێسکەکانی ڕژاندبوو و چیدی فرمێسکی پێ نەمابوو. یەخەی کراسەکەی بۆ لای

سەرەوە هەڵداوە  و دەستی خستە گیرفانەکانیەوە و بەربووە ڕۆیشتن. ئەگەر بەردێکی هاتبایەتە بەر قاچ، بە نووکی پێڵاوەکەی لێی دەدا و ئەگەر گوڵێکی لەبەر پێ بایە، پێی لێ دەنا.

کوڕە شینەکە لە ڕێگا تووشی سەگێکی چکوولەی خوێن شیرین هات. سەگەکە سەیری کوڕەکەی کرد و دەستیکرد بە کلکە سووتە و وەدوای کەوت و وای نیشان دا کە دەیهەوێ ببێ بە هاوڕێی.

"بڕۆ"! کوڕە شینە بە سەگەکەی گوت. "تۆ دەبێ بڕۆی. ئەگەر لای من بمێنیەوە، دەبێ تۆم خۆش بوێ. من ئیتر بە درێژایی ژیانم  پێمخۆش نییە کەسێکیترم خۆش بوێ." بەڵام سەگە هەر سەیری کوڕەکەی دەکرد و زۆر خوێن شیرنانە کلکەسووتەی لەبەر دەکرد. لەپڕێکدا کورە شینە چەکێکی دۆزیەوە کە لە پەنا سەربازێکی  کوژراو بەجێ مابوو. چەکەکەی هەڵگرت و ڕووبەڕوی سەگە خوێن شیرینەکەی ڕاگرت و زۆر بە تووڕەییەوە گوتی: "ئەو چەکە دەتوانێ بتکووژێت!" سەگەکە لە ترسان لێی دوور بۆوە و ڕێگای خۆی گرتە بەر.

"لەگەڵ خۆم دەتبەم!" کورە شینە بە چەکەکەی گوت. "تۆ دەبی بە هاوڕێیەکی باشی من." بە چەکەکە تەقەی لە دارێکی مردوو کرد.

دواتر لەسەر مەزرایەك فڕۆکەیەکی دۆزییەوە. لە ناویدا دانیشت و هەوڵی لێخورینی دا. فڕۆکەکە کاری دەکرد.

"ئێستا، چەکێکم هەیەو فڕۆکەیەك"، کورە شینەکە بە خۆی گوت. "ئەو دوانە ئیتر بنەماڵەی منن. من دەمتوانی سەگێکیشم هەبێ، بەڵام ئەگەر ئەویان بکوشتبایە، ئەوکات هێندە دەگریام هەتا دەمردم."

کوڕەکە بە فڕۆکەکە هەڵفڕی. لەپڕێکدا ماڵێکی کەوتە بەرچاو کە دووکەڵی لێ هەڵدەستا. "لەوێ کەسێك دەژی"، کورە شینەکە گوتی. بە

دەوری ماڵەکەدا فڕی و لەناو پەنجێرەکەوە سەیری ناو ماڵەکەی کرد. ناو ماڵەکە، ژنێکی پیری تێدابوو و خەریکی چێشت لێنان بوو.

کوڕە شینە فڕۆکەکەی لەبەر دەرکەی ماڵەکە ڕاگرت. چەکەکەی هەڵگرت و چووە ناو ماڵەکەوە. "من چەکم پێیە!" کوڕە شینە بە پیرێژنەکەی گوت. "دەبێ شتێکم بۆ خواردن بدەیتێ!"

"من هەر بە بێ ئەوەش شتێکم بۆ خواردن دەدایەی"، ژنە پیرەکە گوتی، "دەتوانی بە ئەرخەیانی چەکەکەت دابنێیت."

"تۆ نابێ لەگەڵ من میهرەبان بیت!" کوڕە شینەکە زۆر بە تووڕەییەوە گوتی. "چەکەکەم دەتوانێ بتکووژێت!"

ژنە پیرەکە خواردەمەنی دایە، و ئەو هەمیسان هەڵفری.

کوڕە شینەکە ئا بەم شێوەیە ژیانی دەبردەسەر. جیگایەکی لە کاولە ماڵێکدا بۆ خۆی تەرخان کردبوو و لەوێ بە شاراوەیی دەژیا. ئەگەر برسی بایە، دەفڕی بۆ جێگایەك کە خەڵکی لێ بووایە، و بە زەبری چەکەکەی مەجبووری دەکردن خواردەمەنی پێ بدەن.

زۆربەی کاتیش بە فڕۆکەکەی بەسەر مەیدانی شەڕەکاندا هەڵدەفڕی و لەتە چەکەکان و شتومەکی پێویست بۆ سەیارە و ئاسنەواڵەکانیتری کۆ دەکردەوە کە لە مەیدانی شەڕدا بەجێ مابوون و دەیبردنە جێگا نهێنیەکەی خۆی.

"من دەبێ بەو شتومەکانەی کۆمکردوونەتەوە رۆبۆتێکی گەورە و مەزن دروست بکەم" کوڕەکە لەبەرخۆیەوە دەیگوت. "رۆبۆتەکە دەبێ سەد میتر درێژ بێ و سەدهەزار تۆن قورس بێت و لە ناو سەریدا جێگای کۆنترۆڵی ڕۆبۆتەکە بۆخۆم تەرخان دەکەم. ئەوکات من زۆر بەهێز دەبم و کەس ناتوانێ خەسارێکم پێ بگەیێنێت."

رۆژێك كیژۆڵەیەک بەلای جێگا نهێنییەکەیدا تێپەڕ بوو. کوڕەکە بە چەکەکەیەوە پەڕیە دەرەوە و گوتی: "دەبێ لێرە بڕۆی! چەکەکەم دەتوانێت بتکووژێ!"

"خۆ من هیچم لە تۆ ناوێ"، کچەکە گوتی. "تەنیا هاتووم بزانم کارگ لە دەشتێ سەریان هەڵداوە."

"دەبێ لێرە بڕۆی!" کوڕەکە گوتی. "پێم خۆش نییە هیچکەس لەلام بێت!"

" لێرە تاك و تەنیای؟" کچەکە لێی پرسی.

"نا"، کوڕەکە گوتی، "من چەکێك و فرۆکەیەکم هەیە و ئەوانە بنەماڵەی منن. رۆژێکیش دێ کە رۆبۆتێکی گەورە و مەزنم دەبێ!"

"هیچ کەسێکی زیندووت لا نییە؟"، کچەکە گوتی.

"دەمتوانی سەگێکم هەبوایە. بەڵام ئەگەر بیانکوشتبایە، هێندە دەگریام تا دەمردم."

"منیش هیچ کەسێکیم نییە"، کچەکە گوتی. "ئێمە دەتوانین پێکەوەبین."

"من پێویستیم بە کەسێك نییە کە چەك بتوانێ بیکووژێ."

"کە وابوو دەبێ لەدوای کەسێك بگەڕێی کە بە چەك نەکووژرێت!" کچەکە ئەوەی گوت و بەپەلە ڕۆیشت و بەجێی هێشت.

کوڕەکە بەو لەت و کوتانە و ئاسنەوالانەی کۆی کردبوونەوە رۆبۆتێکی گەورە و مەزنی دروستکرد و لە ناویدا دانیشت. لە سەرسەرەوە و لە ناو سەری رۆبۆتەکە، کە جێگای کۆنترۆڵ بوو، جێگای بۆ خۆی تەرخان کرد.

پاشان دەستیکرد بە لێخوڕینی رۆبۆتە گەورەکەی بەناو وڵاتاندا. بەهەر جێگایەکدا دەڕۆیشت، کاتێك خەڵکی ئەو ڕۆبۆتە مەزنەیان دەدیت دەیانقیژاند و لەبەری هەڵدەهاتن. بەڵام نەیاندەتوانی خۆ لەو رۆبۆتە مەزنە ڕزگار کەن.

کوڕەکە لەناو ژووری کۆنترۆڵی رۆبۆتەکەدا میکرۆفۆنێکی دامەزراندبوو کە هەرشتێکی بگوتبایە لە دەمی رۆبۆتەکەوە دەهاتە دەرێ و خەڵکی گوێیان لێ دەبوو.

"ئایا کەسێک لە ناو ئێوە دا هەیە کە چەك نەتوانێ بیکووژێ؟" ڕۆبۆت نەڕاندی. بەڵام رووی لە هەرجێگایەك دەکرد خەڵکی لەبەری هەڵدەهاتن و کەسی نەدۆزییەوە کە چەك نەتوانێ بیکووژێ.

رۆژێك لە ڕۆژان لە ژووری کۆنترۆڵەوە بینی کە کەسێك زیادە لەو هەموو خەڵکەی لەبەری هەڵدەهاتن، ڕاوەستاوە و لەبەری هەڵنایە و هەوڵ دەدا شتێکی پێ بڵێ. بەڵام بەهۆی ئەوی کە کوڕەکە لە سەرەوە بوو و مەودای مابەینیان دوور بوو، دەنگی پێی نەدەگەیشت و لێی تێ نەدەگەیشت.

"ڕەنگە ئەوە، کەسێك بێ کە چەك نەتوانی بیکووژێ" کوڕەکە لەبەر خۆیەوە گوتی و لە رۆبۆتەکە دابەزی. بەڵام ئەوکەسە پیرێژنەکە بوو کە ئەوکات نانی دابویە. "دەتهەویست شتێك بە من بڵێی؟" کورەکە گوتی.

"بەڵێ" پیرێژنەکە گوتی. "من بیستوومە کەسێك هەیە، چەك ناتوانێ بیکووژێ!"

"دەی باشە ئەوکەسە کێیە؟" کوڕەکە گوتی.

پیرێژنەکە قامکی بۆ لای ئاسمان هەڵهێنا و گوتی: "ئەو پیاوێکی پیرە کە لەوسەرە و لەسەر مانگ دەژی."

"که وابوو دەبی ئەوکەسە بدۆزمەوە"، کوڕەکە گوتی، "چونکە من هیچکەسێکم ناوێ کە چەك بتوانێ بیکووژێ". دەستی بە دوگمەیەکی رۆبۆتەکەوە نا و لەپڕێکدا رۆبۆتەکە بوو بە کەشتییەکی فەزایی و هەڵفڕی بۆ سەر مانگ.

کوڕەکە لەسەر مانگ ماوەیەکی زۆر گەڕا. بەڵام لەپڕێکدا پیاوە پیرەکەی دۆزییەوە. پیاوەکە لە پشت تلەسکۆپێکی گەورە دانیشتبوو و لەو سەرەوە سەیری گۆ شینەکەی دەکرد.

"ئایا تۆ ئەو کەسەی کە چەك ناتوانێ بیکووژێ؟" کوڕە پرسیاری لە پیاوەپیرەکە کرد.

"پێموایە، وایە"، پیاوەکە وەڵامی داوە.

"ئەدی لە ناو ئەو دووربینەوە چی دەبینی؟"

"من سەیری مرۆڤی سەر گۆی شین دەکەم لەو خوارە."

"دەتوانم لای تۆ بمێنمەوە؟" کوڕە پرسیاری لە پیاوە پیرەکە کرد.

"ڕەنگە"، پیاوە پیرەکە وەڵامی داوە. "بۆچی پێتخۆشە لای من بمێنیەوە؟"

"چونکە من پێمخۆش نییە لای کەسێك بم کە مرۆڤ بتوانێ بیکووژێ، کاتێك دایك و باوکمیان کوشت هێندە گریام کە ئیتر فرمێسکم نەما. من دەمتوانی سەگێکم هەبێ، بەڵام ئەگەر ئەویشیان بکوشتبایە لەبەر گریان دەمردم. دەمتوانی لای پیرێژنێك یا لە لای کچێکیش بمێنمەوە. بەڵام هیچیان لە بەرانبەر چەکدا ناتوانن خۆ ڕابگرن و ئەگەر ئەوانیشیان بکوشتبایە دەبوو هێندە بگریم تا دەمردم."

"زۆر باشە"، پیاوە پیرەکە گوتی "تۆ دەتوانی لای من بمێنیەوە. هیچ کەس ناتوانێ من بکووژێ، چونکە لێرە چەکی لێ نییە."

"هەمووی تەنیا لەبەر ئەو هۆیەیە؟"، کوڕەکە لێی پرسی.

"بەڵێ!" پیاوە پیرەکە گوتی.

"بەڵام من چەکەکەم لەگەڵ خۆم هێناوەتە ئێرە."

"حەیف"، پیاوە پیرەکە گوتی، "ئێستا ئیتر ناتوانی لای من بمێنیەوە. چەکەکەت دەتوانێ من بکووژێت."

"کە وابوو ئیتر من دەبێ بڕۆم" کوڕەکە گوتی.

"بەڵێ!" پیاوە پیرەکە گوتی.

"حەیف!" کوڕەکە گوتی.

"بۆی نارەحەتی؟" پیاوە پیرەکە لێی پرسی.

"بەڵێ!" کوڕەکە گوتی "من لە ناخی دڵمەوە پێمخۆشبوو لێرە بمێنمەوە."

"بۆی هەیە بتوانی چەکەکەت فڕێ دەی؟" پیاوە پیرەکە گوتی.

"ڕەنگە!"، کوڕەکە گوتی.

"ئەوکات دەتوانی لای من بمێنیەوە"، پیاوە پیرەکە گوتی.

"ڕەنگە!"، کوڕەکە گوتی "ئەدی لای تۆ چی بکەم؟"

"دەتوانی سەیری ئەو تلەسکۆپە بکەی. ڕەنگە بتوانی هۆی ئەوە بدۆزیەوە کە خەڵک لەو خوارە بۆچی بە دوای شەڕدا دەگەڕێن."

"باشە، بۆچی بەدوای شەڕدا دەگەڕێن؟"

"منیش نازانم. ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت کە زانیارییان لەسەر یەکتر زۆر کەم بێت. یاخود هێندە زۆرن و ژیانیان وەها ئاڵۆزە، کە کەس نازانێ کردەوەکانیان چی بەدوادا دێت. یا نازانن ئەو گۆشتەی دەیخۆن لە کوێوە دێت، یا ئەو نانەی دروستی دەکەن، بۆکوێ دەچێت. یاخود نازانن ئەو ئاسنەی لە ژێر زەوی دەیهێننە دەرێ، کەرەسەی خانووبەرە سازی پێ ساز دەکرێ یا تانك و تۆپی ماڵوێرانکەر. ڕەنگە ئەگەر ئەوان بیانتوانیبایە لەوسەرەوە سەیری خۆیان بکەن، زۆر شتیان لێ حاڵی بوایە و باشتر تێگەیشتبایەن."

"دەبێ مرۆڤ ئەوەیان پێ پیشان بدەن." کوڕەکە گوتی.

"ڕەنگە!"، پیاوە پیرەکە وەڵامی داوە. "بەڵام بۆ ئەو کارە من پیر بووم و ئیتر زۆر ماندووم."

لێرەدا کوڕەکە چەکەکەی فڕێدا خوارەوە و بە ناو کاکەشاندا کەوتە سەر گۆکە و ورد و پرد بوو.

کوڕە شینەکە بۆ ماوەیەکی یەکجار زۆر لەسەر مانگ و لای پیاوە پیرەکە مایەوە و لەوسەرەوە بە تلەسکۆپەکە سەیری مرۆڤی سەر گۆی شینی دەکرد. ڕەنگە ڕۆژێك گەڕابێتەوە بۆ سەر گۆیەکە و بە خەڵکی گوتبێ هەڵەکانیان چی بوون.

# گۆی خواردەمەنی

**نووسەر: مارتین ئاوەر**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

لە سەر گۆیەکی چکوولانە هەر وەك چۆن لەسەر گۆی زەوی خۆمان مرۆڤ دەژین، کەسانێك دەژیان. هەرکام لەوان بۆ دابینکردنی خواردەمەنی خۆیان و بنەماڵەکەیان چەشنە خواردەمەنییەکیان بەرهەم دەهینا. لە هەوەڵەوە هەندێکیان "چالاك" بوون و تاقمێکیشیان "کەمتر چالاك". دواتر کەسانێکیان لێ پەیدا بوو کە "زۆر چالاك" و کەسانێکیش "زۆرتەمبەڵ" و تەوەزل. بە واتەیەکی تر ژیانیان وەك هەموو گۆیەکانی تری ئەم ئۆنیوێرزامە بەڕێوە دەچوو.

تەنیا جیاوازییەکی ئەو گۆ بچووکە لەگەڵ ئەوانیتر ئەوە بوو کە هەموو بەشدارانی کۆمەڵگا بە "چالاك"، "کەمتر چالاك"، "کەمتر تەمبەڵ" و "تەمبەڵەوە"، ئەو خواردەمەنییانەی وا بەرهەمیان دەهێنا، لە جێگایەك کۆیان دەکردنەوە و هەر کەس پێویستی بە خواردەمەنی بایە لەو کۆگایە بەشی خۆی لێ هەڵدەگرت.

ماوەیەك بەو شێوەیە ژیانیان دەبردە سەر. بەڵام رۆژێك لە رۆژان هەندێك لە "زۆر چالاك"ەکان گوتیان:

"ئیتر بەسە و لە ئەندازە بەدەریان کردوە". ئێمە تەواوی رۆژ ئیش دەکەین و خواردەمەنی بەرهەم دێنین. کەچی ئەو تەمبەڵانە تەواوی رۆژ لەسەر گازی پشت لەبەر تاو بۆی ڕاکشاون و فیتووی بۆ لی دەدەن و خەریکی خواردنی بەرهەمەکانی ئێمەن. کە وابوو ئێمەش ئەو خواردەمەنییانەی

بەرهەمی دێنین ئیتر لە جێگا گشتییەکە داینانێین و هەرکاممان لە پەنا ماڵی خۆمان کۆی دەکەینەوە و لێی دەخۆین.

بەڵام "تەمبەڵ"ەکان وەك هیچ نەقەومابێت، هەر وەك پێشوو لە جێگا گشتییەکە دەیانخوارد و سەیر ئەوە بوو کە گەلێک زیاتر لەوەی کە بەرهەمیان دەهێنا، خواردەمەنییان دەخوارد!

دوای ماوەیەك "کەمتر چالاك" و "کەمتر تەمبەڵەکان"یش هەستیان بەوە کرد کە خواردەمەنییان کەمتر لە جاران پێ دەبڕێ. چونکە ئێستا ئیتر "زۆر چالاك" ەکان بەشی خۆیان ناخەنە سەر جێگا گشتییەکە. "کەمتر چالاك" ەکان گوتیان:

کە وابوو ئێمەش بەشی خۆمان ئیتر لەسەر جێگا گشتییەکە دانانێین و لای خۆمان ڕایاندەگرین. بەو شێوەیە "زۆر چالاك" و " "کەمتر چالاك"ەکان بەشی خۆیان لە پەنا ماڵەکانیان کۆدەکردەوە و لێیان دەخوارد.

ئەوە بووە هۆی ئەوی کە "کەمتر تەمبەڵ"ەکانیش هیچ ڕێگایەکیتریان بۆ نەمێنێ و لە تاوی مفتە خۆرەکان کە شاڵاویان بۆ سەر خواردنەکانیان دەبرد، هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە لاسایی "زۆر چالاك" و " "کەمتر چالاك"ەکان بکەنەوە، واتە ئەوانیش خواردەمەنییەکانیان لە پەنا ماڵی خۆیان کۆ بکەنەوە.

وای لێهات کە هەرکام لەو گرووپانە ئەو خواردەمەنییانەی بەرهەمیان دێنان لە پەنا ماڵەکەی خۆیان کۆیان دەکردنەوە و تەنیا خۆیان و بنەماڵەکەیان لێیان دەخوارد. ئەگەر یەك لەو گرووپانە پێویستییان بە خواردەمەنییەك بایە کە خۆیان بەرهەمی ناهێنن، لەگەڵ ئەوانیتر دەیانگۆڕییەوە و بەو شێوەیە هەوڵیان دەدا کە هەموو خواردەمنییەکانیان لەبەر دەست دا بێت.

بەدوای ئەو گۆڕانکارییەدا "تەمبەڵ"ەکان کە برسیەتی هێرشی بۆ هێنابوون و ئیتر جێگا گشتییەکەیان لێ تێك چوو بوو، لای خۆیان دەیانگوت:

"ئەو بارودۆخە تەواو نوێ یە"، تا ئێستا شتی وامان بەسەرنەهاتووە!

بۆ ئەوان ئیتر جێگایەکی گشتیی نەمابوو تا بە مفتێ لێی بخۆن و لێی ڕاکێشن. ئەوە بووە هۆی ئەوی کە هەرکام لەو تەمبەڵانە ڕێگای هەڵس و کەوتی جیاواز بگرنەبەر.

هەندێکیان دەیانگوت: "دەی باشە، ئێمەش دەبی کار بکەین و خواردەمەنیی خۆمان دابین بکەین!" بەڵام ئەوە هەر بە قسان خۆش بوو، چونکە هێند لەمێژ بوو کاریان نەکردبوو، زەوییەکی دیاریکراویان نەبوو کاری لەسەر بکەن. کاتێك دەچوون و جێگایەکیان بۆ کارکردن دیاری دەکرد، یەکی تر دەهات و دەیگوت: "ئەوە جێگای منە و لەوەتا لەبیرم دێ هی باب و باپیری من بووە و دوای ئەوانیش هەر من لەسەر ئەو زەوییە کارم کردووە و ئەوە زەوی منە" و دەریان دەکردن.

تاقمێک لەو "تەمبەڵ"انەش کە هیچ وڕەی کارکردنیان نەبوو و بە خەیاڵیش بیریان لە کارکردن نەدەکردەوە، شاڵاویان دەبردە سەر جێگای دەوڵەمەندەکان و لەوێ خواردەمەنییان بە ئیشتیای خۆیان هەڵدەگرت. دەیانگوت: "ئەو کارە زۆر ئاساییە و ئێمە تا ئەمڕۆ هەر لەسەر زگی ئەوانیتر و لە کۆگا لەوڕاوین"! ئەگەر ئێستا یەك جێگای تایبەت نییە و بۆتە چەندین جێگای جیا جیا، دەی باشە ئێمەش لەو جێگایەی پێمان خۆشبێت، خواردەمەنی هەڵدەگرین.

دیارە ئەو بۆچوونەی "تەمبەڵ"ەکان بە دڵی خاوەن خواردەمەنییەکان نەبوو. هەندێك لەوان دەستیان کرد بە حەسار کێشان بەدەوری کۆگاکانیاندا بۆ ئەوەی دەستی "تەمبەڵ"ەکان پێیان نەگات. هەروەك لە

ژیانی ئێمەشدا چاولێکەری باوە، وردە وردە حەسار کێشان بووە باو و هەر کەس حەسارێکی بە دەوری کۆگاکەیدا دەکێشا.

ئەوندەی حەسارەکان زیاتر دەبوون، بەو ڕادەیەش شاڵاوی تەمبەڵەکان بۆسەر ئەو جێگایانەی بێ حەسار بوون، زیاتر دەبوو. ئەوە بووە هۆی ئەوی کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەموو خاوەن خواردەمەنییەکان حەساریان بە دەوری کۆگاکانیاندا کێشا.

لە پەنا کار کردن بۆ بەرهەمهێنانی خواردەمەنییەکان دەبوو لە لایەکەوە کات بۆ گۆڕینەوەی خواردەمەنییەکان تەرخان بکەن و لە لایەکیتریشەوە، حەسار دروست کەن و پێی ڕابگەن و ئاگایان لە بەرهەمەکانیان بێ کە لێیان نەدزن.

هەندێکیان دەردی دڵیان دەکرد و پرتە و بۆڵەیان بوو کە جاران دوای کار لە پەنا جێگای خواردەمەنییەکان کۆ دەبووینەوە و قسە و جەفەنگمان دەکرد و پشوومان دەدا، بەڵام ئێستا دوای کار دەبی ئاگامان لە شتە کانمان بێت و بە حەسارەکەمان ڕابگەین و باشتر و قایمتری کەین. بەیانیش هێندە ماندووین کە ناتوانین وەك جاران خواردەمەنی بەرهەم بێنین. زۆر سەیرە سەرەڕای ئەوی ئێستا ئیشمان لە جاران زیاترە بەڵام بەرهەمەکەمان کەمترە!

هەندێك پێشنیاریان دەکرد کە وەرن بچینەوە سەر خوو و خدەی جاران و هەمووومان بەرهەمەکانمان وەك جاران لە یەک جێگا کۆ کەینەوە. دیارە بەو کارە تاقمێك مفتەخۆر تێر دەکەین بەڵام لای کەم وەك جاران کاتی زیادیمان بۆ پشوو دان دەبێ و وەك ئێستا هێندە ماندوو نابین.

بەڵام چەند لە دەوڵەمەندەکان دەیانگوت : "نا، ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەر خوو و خدەی جاران، دەبێتە هۆی پەرە پێدانی مفتەخۆریی. کە ئەوەش دەبێتە هۆی تەمبەڵ بوونی بەشدارانی کۆمەڵگا. هەرچی تەمبەڵ

زیاتر بێ، بەو ئەندازەیەش بەرهەممان کەم دەبێتەوە. بەو شێوەیە لە داهاتوویەکی نزیکدا هەموومان لە برسانە دەمرین".

"بەڵام ئەوە چارەی کێشەکە نییە!" ئەوانیتر گوتیان. ڕەنگە ڕۆژێك بێت کە بۆ زۆربەی ئەو تەمبەڵانە ئەو بارودۆخە واتە ڕۆژ تا ئێوارە لەسەر گازی پشت لەبەر تاو ڕاکشان و بە فیتوو لێدان مفتەخۆریی کردن، ماندووکەرە بێ و خۆیان بێنە سەر ئەو قەناعەتەی ئەوانیش کار بکەن. چونکە بەرهەم هێنان و کارکردن زۆر خۆشە و کەیفی پێ دەکەین.

"نا، وانییە"! دەوڵەمەندەکان گوتیان. کار کردن و بەرهەمهێنان خۆش نییە، بەڵکوو خواردنی بە مفتە، خۆشە.

ئێوە دەتوانن و مافی خۆتانە بەرهەمی خۆتان بەش کەن. ئێمە حەسارەکانمان تێك نادەین و نابینە هۆی پەرەپێدانی مفتەخۆریی.

"ئەگەر دەوڵەمەدندەکان حەساری خۆیان تێك نەدەن، ئێمەش هێندەمان خواردەمەنیی نییە کە لە نێو مفتەخۆرەکاندا بەشی کەین"، ئەوانیتر گوتیان.

نیوە هەژارەکانیش گوتیان: "ئەگەر تەنیا ئێمە بمێنینەوە و مەجبوور بە بەشکردن بکرێین، بەشەکان هێندە کەم دەبن کە هیچمان پێ نابڕێ. کە وابوو ئێمەش حەسارەکانمان تێك نادەین".

ئەگەرچی هەموو گرووپەکان دەیانزانی کە لە داهاتوودا کاریان زیاتر دەبێ و کاتی پشوویان کەمتر، بە بێ ئەوی کە بەرهەمیشیان زیاتر بێ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەسەر ئەو بڕیارە مانەوە و نەگەڕانەوە سەر خوو و خدە قەدیمییەکەیان.

بەڵام بە پێی کات، شتی زۆر سەیرتر قەوما. هەندێك لەو کەسانەی کە بەرهەمیان زۆر کەم بوو، چوون بۆ لای دەوڵەمەندەکان و گوتیان:

"ئەگەر خواردەمەنی من و بنەماڵەکەم دابین بکەن، ئاگامان لە خواردەمەنییەکانتان دەبێت".

تاقەمێکیش پێشنیاریان کرد: "ئەگەر خوادەمەنی ئێمەش دابین بکرێ، خۆمان بە چاکسازی و قایمکردنی حەسارەکانتانەوە ماندوو دەکەین".

هەروەها کەسانێکیش ماڵ بە ماڵ دەگەڕان و دەیانگوت: "خواردەمەنیمان دابین بکەن، ئێمەش ئەرکی گۆڕینەوەی خواردەمەنییەکانتان دەخەینە سەر شانمان".

بەو شێوەیە ماوەیەك گوزەرانیان کرد. بەڵام دواتر دەوڵەمەندەکان بە قامکێك سەری خۆیان خوراند و گوتیان:

"لە ڕاستیدا، ئێستا کە ئەو کارگەرانە کارەکانمان بۆ دەکەن، دەبوو کاتی پشوودانمان زۆرتر بایە، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین خواردەمەنیی ئەو کارگەرانە ، دابین بکەین، دەبێ زیاتر لە جاران خواردەمەنیی بەرهەم بێنین!"

هەمیسان پێشنیار کرا: "وەرن حەسارەکانمان تێك دەین و بچینەوە سەر شێوازی قەدیم، ئەو هەموو ژانەسەرە بۆ ئێمە جێ بەجێ نابێ. بەڵام ئەمجارە نە تەنیا دەوڵەمەندەکان بەڵکوو هەژارەکانیش ئەو پێشنیارەیان ڕەد کردەوە و بە تووڕەییەوە دەیانگوت:

"دەتانهەوێ بێ کارمان بکەن؟" ئەوانەی چاک کردنەوەی حەسارەکان لەسەر شانیان بوو گوتیان.

"دەتانهەوێ لە برسانە بمانکووژن؟" ئەوانە گوتیان کە خواردەمەنییەکانیان دەگۆڕییەوە و ئەو کەسانەش کە ئاگادارییان لە حەسارەکان دەکرد.

بەڵێ، بەمجۆرە لەسەر ئەو خوو و خدە نوێیە مانەوە...

# ترس

## نووسەر: Martin Auer (مارتین ئاوەر)

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

بۆچی
ئەو لەوێوە ئاوا
بە گومانەوە سەیرم دەکا؟
بڵێی ترسی لە من هەبێ؟

بڵێی پێیوابێ، من دەمهەوێ زیانێکی پێ بگەێینم؟

بۆچی
ئەو پێیوایە،
من دەمهەوێ شتێکی لێ بکەم؟
من خۆ کارم بە کەس نییە!

من کارم بە کەس نییە، جگە لەوی کە،
کەسێك بیهەوێ زیانێکم پێ بگەێینێ!

کە وابوو ئەگەر ئەو پێی وابێ،
من دەمهەوێ زیانێکی پێ بگەێینم،
تەنیا بەو هۆیەیە، چونکە ئەو دەزانێ : من زیان بەو کەسە دەگەێینم،
کە بیهەوێ زیانم پێ بگەێینێ.
کە وابوو:
ئەو دەیهەوێ زیانم پێ بگەێینێ!

که وای لێ هات، هەر ئێستا دەچم و مستێك لە ناو دەمی دەدەم،
تا ئەو نەتوانێ هیچم لێ بکات.
ئەیش!
مستی ئەو زۆر گورج تر بوو لە هی من.
ئێستا من لەسەر زەوی کەوتووم.

بەڵام من دەمزانی،
کە ئەو دەیهەوێ زیانێکم پێ بگەیێنێ!

# جارێکیتریش ترس

**نووسەر: Martin Auer (مارتین ئاوەر)**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

ئێمە وڵاتێکین کە ئاشتیی مان دەوێ و
هێرش بۆ سەر هیچ کەسێک نابەین
مەگەر ئەوەی کەسێك هێرشمان بۆ بێنێت.

هەرکەس پلانی نەبێ
هێرش بۆ ئێمە بێنێ،
هیچ جێگای مەترسی نییە و پێویست بەوە ناکات ترسی لە ئێمە هەبێ.

هەر کەس خۆی لە بەرانبەر ئێمەدا
بپارێزێ،
بەڵگەیە بۆ ئەوەی
ترسی لە ئێمە هەیە.

هەرکەس ترسی لە ئێمە هەبێ،
بەڵگەیە بۆ ئەوەی
پلانی هەیە
هیرشمان بکاتە سەر.

کەوابوو زۆر روونە،
ئێمە هێرش بۆ ئەو کەسە دەبێ ببەین،
کە پلانمان بۆ دەکێشێ.

# خەڵکە سەیرەکەی سەر گۆی میوەجات

**نووسەر: Martin Auer (مارتین ئاوەر)**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

گۆی میوەجات گۆیەکی چکوولانە بوو کە لە چەند گوند پێکهاتبوو. لە هەریەك لەو گوندانە میوەیەك بەرهەم دەهێنرا. خەڵکی گوندەکان بە ناوی میوەکەیانەوە نێودێر کرابوون. وەك: خەڵکی گوندی سێو، خەڵکی گوندی هەرمێ، خەڵکی گوندی پرتەقاڵ و خەڵکی گوندی بەهێ و ... هتد. خەڵکی سێو بۆ بژیو لە کومپوتی سێو، ئاوی سێو، کەیکی سێو و مرەبای سێو کەڵکیان وەردەگرت. خەڵکی هەرمێش لە کومپوتی هەرمێ، ئاوی هەرمێ، کەیکی هەرمێ و مرەبای هەرمێ بژیوان دەکرد. هەر بەو شێوەیەش ژیان لە گوندەکانی پرتەقاڵ و بەهێ و ئەوانیتردا بەڕێوە دەچوو.

بۆ ماوەیەکی زۆر ژیانی خەڵکی ئەو گوندانە بە باشی بەڕێوە دەچوو و هیچ کێشەیەکیان نەبوو. بەڵام رۆژێك لە ڕۆژان تاقمێك خەڵکی هەرمێ کە لە خواردنی هەرمێ ماندوو ببوون، گوتیان: دەزانن چی؟ "ئێمە دەبێ ببین بە دز!"

"دز"؟ "ئەوە ئیتر چییە؟"

"زۆر ساکارە: بە ئەسپایی و لە تاریکی شەودا خۆمان لە خەڵکی سێو کە لە خەو دان، نزیك دەکەینەوە و دەست دەکەین بە لێدانیان. دواتر تا ئەو جێگایەی بۆمان هەڵدەگیرێ، سێویان لێ دەدزین و گورجێك دەگەڕێینەوە بۆ گوندی خۆمان. ئەوکات دەتوانین ئێمەش کومپوتی سێو، ئاوی سێو، کەیکی سێو و مرەبای سێو بخوێن!"

"ئێ زۆر باشە!"، "ئافەرم". خەلکی هەرمێ بە هاوار هاوار چەپڵەیان بۆ لێدان و گوتیان: "بە خوا ئەوە کارێکی زۆر خۆشە!"

بەڵێ... بێ ئەوەی بە باشی بیر لە داهاتووی ئەو کارە بکەنەوە بە ئەسپایی و لە تاریکی شەودا هێرشیان بردە سەر ماڵەکانی خەڵکی گوندی سێو کە لە خەوی خۆشی خۆیاندابوون. تیروپڕیان لێ دان و تا ئەو جێگایەی بۆیان هەڵگیرا، سێویان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت و بۆی دەرچوون.

خەڵکی گوندی سێو زۆر ترسان و یەکجار پەشۆکاو و خەمناك بوون. "ئەوە چی بوو؟" بە یەکتریان دەگوت. کارەساتی ئەوها تا ئێستا نەقەوماوە! رەنگە خەڵکی گوندی هەرمێ هەموویان شێت بووبن؟ دەبێ پوورە مێشێ یان بنێرینە لا، بۆئەوەی چاکیان کاتەوە!"

پوورە مێشی ژنێکی پیری خوێن شیرین بوو کە چەشنە رۆنێکی سیحراوی لە نێوکی سێو دەگرت و بۆ دەرمانی نەخۆشەکانی گوند کەڵکی لێ وەردەگرت. خەڵکی گوندەکە متمانەیەکی زۆریان بە پوورە مێشێ هەبوو.

بەڵێ... بەیانی زوو پوورە مێشێ گۆزەی پڕ لە ڕۆنی سیحراوی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و بۆ دەرمانی خەڵکی گوندی هەرمێ وەڕێ کەوت.

بەڵام لای ئێوارە پوورە مێشێ گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیان و گوتی: "ئەوان نایانهەوێ خۆیان دەرمان بکەن." "هەڕەشەیان لێ کردم و لە گوندەکەی خۆیان دەریان کردم."

"بەڕاستی ئەوە زۆر سەیرە!"، خەلکی سێو گوتیان، "ئێستا چی بکەین؟"

"ئەگەر ئەوان نەیانهەوێ خۆیان دەرمان بکەن، وا دیارە نەخۆش نین، بەڵکوو خەڵکێکی تووڕە و خراپن. کە وا بوو ئێمە دەبێ تۆڵەی خۆمانیان لێ بکەینەوە!"

"بەڵێ  تۆڵەی خۆمان دەکەینەوە، ئێمەش هێرشیان دەکەینە سەر و لێیان دەدەین و هەرمێ کانیان دەدزین. ئەوە مافی خۆمانە!"

خەڵکی سێو هەموویان دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و هەر کەس لە لایەکەوە دەیگوڕاند و تەنیا لەو ناوەدا پوورە مێشێ سەری ڕادەوەشاند و زۆر پەشێو و خەمناك بوو.

هەر وەك بڕیاریان دابوو، خەڵکی سێو نیوەشەو کاتێ خەڵکی هەرمێ لە خەوی شیرین دا بوون، هێرشیان کردنە سەر و تێر و پڕیان لێدان. دوایی تا ئەو جێگایەی بۆیان هەڵدەگیرا هەرمێ یان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت و دەرباز بوون.

"ئەی چی دەکەن ئەگەر ئەوانیش بۆ تۆڵە سەندنەوە هەمیسان هێرشیان کردینەوە سەر؟" پوورە مێشێ پرسیاری لێ کردن.

هەموو زۆر بە نگەرانییەوە سەیری پوورە مێشێ یان  دەکرد، تا یەك لە کوڕە ئازاکانی گوند بە ناوی "شەڕ" گوتی: "ئێمە گەنجانی گوند دەبێ بە نۆبە لە دەوری دێ گۆپاڵ بەدەست کێشك بکێشین و ئەگەر هاتن هێرشیان دەکەینە سەر و تێروپڕیان لێ دەدەین."

بەڵێ... کوڕانی گوند هەر وەك "شەڕ" پێشنیاری کردبوو، گۆپاڵ بە دەست لە دەوری گوندەکەیان کێشکیان دەکێشا. هەر وەك پوورە مێشێ پێشتر پێشبینی کردبوو، شەوێکیان خەڵکی هەرمێ بۆ تۆڵە سەندنەوە هاتبوونە سەر گوندی سێو و لە پڕێکدا کەوتنە بەر هێرشی کێشکچیان و هەموویان بە برینداری  گەڕانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان.

"فەرموون، هەر وەك من گوتبووم، نیشانمان دان کە ئێمە لەوان زۆر بەهێزترین!" بە غرووریکی زۆرەوە "شەڕ" بە خەڵکی گوندی گوت. "ئیتر پێموانییە بەو زووانە بتوانن هێرشمان بکەنە سەر."

"زۆر جوان و بە ڕێ وجێیە" گەنجانی گوند کە ماوەی دوو حەوتوویەك بوو کێشکیان دەکێشا، گوتیان. بەڵام دەزانی چییە، روویان کردە "شەڕ" و گوتیان: "ئێمە ئەوە ماوەی دوو حەوتووە بە شەو کێشك دەکێشین و بە ڕۆژ دەخەوین. لەو ماوەیەدا هەموو کومپوتی سێو و کەیکی سێو و مربای سێوەکانمان خواردوە و کاتمان بۆ دروستکردنی خواردەمەنی نەبووە."

"کە وابوو ئەوە ئەرکی خەڵکی گوندەکەیە و دەبێ ئەوان خواردەمەنی ئێمە دابین بکەن." شەڕ گوتی. "چونکە ئەوە روونە کە ئێمە کێشکمان بۆ هەموویان کێشاوە!"

لەمە بەولاوە هەموو خەڵکی گوندی سێو بەشێک لە خواردەمەنییەکەیان بۆ کێشکچییان تەرخان دەکرد. بەشی "شەڕ" لە هەموان زۆرتر بوو. "چونکە من دەبێ ئاگام لە هەموویان بێت!" "شەڕ" دەیگوت. "من بەرپرسیایەتیم لەسەر شانە!"

دوای ماوەیەك خەڵکی گوندی سێو بۆڵەبۆڵیان لێ پیدا بوو کە بەو هۆیەی گەنجەکان ئیتر کار ناکەن و بە جێی هاوکاریی گشتیی واتە دروستکرنی کومپوت و مربا و خواردەمەنیتر، خەریکی کێشك کێشانن، خواردەمەنی وەك جاران بەشی هەموویان ناکات.

"بەڵێ وایە"، "شەڕ" گوتی، "خەتای کێیە کە گەنجەکانمان بە جێی کارکردن خەریکی کێشك کێشانن؟ دیارە خەڵکی گوندی هەرمێ! کەوابوو دەبێ هەر خۆشیان تاوانەکەی بدەن!"

"شەڕ" گەنجەکانی گوندی کۆ کردەوە و هێرشی بردە سەر گوندی هەرمێ کە جارێکیتریش لێ یان بدەن و هەرمێکانیان لێ بدزن! بەڵام خەڵکی گوندی هەرمێش کێشکچییان دانابوو و لە ناویاندا بوو بە شەڕێکی

زۆر قورس و گران و دوای بریندارێکی زۆر لە هەردوك لا، خەڵکی سێو بەبێ هەرمێ گەڕانەوە بۆ گوندی خۆیان.

"شەڕ" گوتی: ئێمە ئەمجار دەبێ تۆڕ بچنین و کاتێ هێرش دەبەینە سەر گوندی هەرمێ، دەیهاوینە سەر کێشکجییەکان و بەوجۆرە دەتوانین زەفەریان پێ بەرین و ڕاو و ڕووتیان کەین.

خەڵکی گوندی سێو هەموو بە وتەی "شەڕ" بەربوونە چنینی تۆڕ و ئەمجارە توانیان بیانشکێنن و هەرمێکانیان لێ بدزن.

"شەڕ" بە سەربەرزی لە پێش لەشکرەکەیەوە بەرەو گوند دەگەڕایەوە و هەرکام لە لاوەکان تەلیسێکیان هەرمێ لەسەر شانیان دانابوو. دیارە "شەڕ" بە بێ تەلیس و بێ ئەوەی خۆی ماندوو بکات لە پێشیانەوە دەڕۆیشت، چونکە ئەو بەرپرسایەتی هەموویانی لەسەر شان بوو.

"شەڕ" "دەستووری دا کە هەرمێکان لە ناوەڕاستی گوندەکە کۆ کەنەوە و کۆگایەکی لێ دروست بکەن. دواتر ئەمری کرد کۆگا گەورەکە بکەن بە سێ بەش و سێ کۆگای چکوولەی لێ سازبکەن. ئەو گوتی: کۆگایەك لە مابەین خەڵکی گوندەکەدا بەش کەن، کۆگای دووهەم بۆ سەربازەکانم چونکە ئاوا ئازایانە شەڕیان کردووە و کۆگای سێهەمیش بە تەنیا بۆ خۆم چونکە بەرپرسایەتیی هەمووتانم لە ئەستۆیە."

هەموو خەلکی گوندەکە چەپڵەیان بۆ "شەڕ" لێدا و لەسەر شانی خۆیان دانا. تەنیا ژنە پیرەکە واتە پوورە مێشێ بە نگەرانییەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی: "ئەی ئەگەر خەڵکی هەرمێش خەریکی تۆڕ چنین بن، چی؟"

"من ئیتر دەزانم چی بکەین!"، "شەڕ" گوتی. "ئێمە دیوارێکی بەرز بە دەوری گوندەکەماندا دەکێشین، کە ئیتر نەتوانن هێرشمان بکەنە سەر."

بەلێ ... خەڵکی گوندی سێو مەجبوور کران  دیوارێکی بەرز بە دەوری گوندەکەیاندا بکێشن کە ئەوەش خۆی کاتێکی زۆری لێ گرتن.

بەڵام خەڵکی هەرمێش کە بیستبویان گوندی سێو خەریکی دیوار کێشان بە دەوری گوندەکەیانن، نەیانویست لەوان بەجێ بمێنن و ئەوانیش دیوارێکی بەرزیان لە دەوری گوندەکەیان دروست کرد. خەڵکی گوندی هەرمێ نەک هەر تۆڕیان بۆ هاویشتنە سەر کێشکچییەکان چنی، بەڵکوو نەردیوانی زۆر درێژیشیان دروست کرد تا بتوانن وەسەر دیوارەکەی گوندی سێو کەون. شەوێکیان لە تاریکیدا بە تۆڕ و نەردیوان هێرشیان بردە سەر گوندی سێو و ڕاو و ڕووتیان کردن.

"ئیتر بەسە!" ئاغای "شەڕ" گوتی. "ئێمە دەبێ دەرسێك بەو خوێڕییانە بدەین کە تا هەن لە بیریان نەچێتەوە!"

"شەڕ" دەستووری دروستکردنی قەڵایەکی گەورەی دا کە لەسەر چەرخ دروستکرابێ و بتوانن لەگەڵ خۆیان ڕایکێشن. ئەو دەیهەویست بە پاڵپێوەنان ئەو قەڵایە بباتە تەنیشت دیواری گوندی هەرمێ و لەوسەرەوە ئاور بخاتە ناو ماڵەکانیانەوە. بەڵام لەو ماوەیەشدا خەڵکی گوندی هەرمێ قۆچەقانییەکی گەورەیان بۆ پارێزگاری گوندەکەیان دروست کرد کە دەیانتوانی بەردی زۆر گەورەی پێ حەوادەن.

لە شەوێکی تاریکدا کە چاو چاوی نەدەدیت، لەشکری گوندی هەرمێ بۆ هێرش کردنە سەر گوندی سێو وەڕێ کەوت. هاوکات لەشکری گوندی سێویش هەر ئەو شەوە بە بێ ئەوەی بزانن کە هێرشیان دەکرێتە سەر، کەوتنە ڕێ بۆ تۆڵە سەندنەوە لە گوندی هەرمێ. بەو هۆیەی زۆر تاریك بوو، دوو لەشکرەکە بە بێ ئەوەی هەست بە یەکتر بکەن لە پەنای یەکترەوە تێپەڕ بوون. کاتێك لەشکری گوندی سێو قەڵاکەیان لە پەنا دیواری گوندی هەرمێ دامەزراند، ئاغای "شەڕ" چووە سەر قەڵاکە و

لەوێوە نەڕاندی: "دەروازەکە بکەنەوە و خۆ بە دەستەوە دەن، دەنا تەواوی گوندەکەتان لێ دەسووتێنین."

لەبەرئەوەی لەشکری گوندی هەرمێ لەماڵەوە نەبوون، گورجێك دەروازەکەیان لێ کردنەوە و ئیزنی هاتنە ژووری دوژمنیان دا. کاتێکیش لەشکری گوندی هەرمێ گەییشتنە پەنا دیواری گوندی سێو، قۆچەقانییە گەورەکەیان دامەزراند و سەرکردەکەیان لەسەر کوتە کاغەزێك نووسی :

"خۆتان بە دەستەوە دەن، دەنا گوندەکەتان خاپوور دەکەین!" کوتە کاغەزەکەی لە بەردێك هاڵاند و بە قۆچەقانییەکە خستییە ئەودیوی دیوارەکە. خەلکی گوندی سێو هیچ ڕێگایەکی تریان نەما و دەروازەیان لێ کردنەوە.

بەڵام کاتێك لەشکری گوندی سێو دەستی بە دزین کرد، دیتیان هیچ خواردەمەنییەکیان نەماوەتەوە. تەنیا چەند چۆر مربای هەرمێ و چەند لەت کەیکی ئیشك بوو و کەمێکیش کومپوت کە هەمووی برشی هێنابوو.

"ئیتر هیچمان نەماوەتەوە"، خەڵکی گوندی هەرمێ گوتیان. "ئێمە کاتی دروستکردنی خواردەمەنیمان نەبووە و هەموو کاتمان بۆ دروستکردنی کەرەسەی شەڕ تەرخان کردووە."

"ئێمەش هیچ خواردەمەنییەکمان نەماوەتەوە" خەڵکی گوندی سێو بە لەشکری گوندی هەرمێیان گوت. ئێمە تەنانەت چونکە کاتمان نەبووە سێوەکان لە دارەکان بکەینەوە، هەر هەموویان ڕزیون و خراپ بوون. بەداخەوە ئێمە هەموو کاتمان بە هۆی شەڕەوە گیراوە.

"بەزیاد نەبێ" سەرۆکی لەشکری گوندی هەرمێ گوتی و ڕێی گوندەکەیان گرتەبەر.

"به جەهەننەم" سەرۆکی گوندی سێو گوتی و ئەوانیش بەرەو گوندەکەیان وەڕێ کەوتن. بەرەبەیانیی ئەو ڕۆژە هەوا تازە خەریکبوو ڕوون دەبۆوە، هەر دووك لەشکرەکە لە نێوەی ڕێگا تووشی یەکتر بوون. چونکە هیچکامیان دەستکەوتی خواردەمەنییان نەبوو، بە تووڕەیی بەربوونە گیانی یەکتر. بەڵام دوو سەرۆکەکە تەنیا سەیریان دەکردن و بۆڵەیان دەهات و ئیتر ئەوان شەڕیان نەکرد. کاتێك دوو لەشکرەکە هەموو سەر و گوێلاکیان شکا، سەرۆکەکان دەستووری کشانەوەیان دا و هەر کەس بە لەشکری خۆیەوە گەڕاوە بۆ ماڵەوە.

ڕۆژی دوایی ئاغای "شەڕ" خەڵکی گوندەکەی خۆیانی کۆ کردەوە و گوتی: " ئێمە دەبێ بە گورجی خەریکی دروستکردنی خواردەمەنی بین و کەیك و مربا و کومپوت دروست بکەین. ئێمە دەبێ زۆر زووتر لە دوژمن دەست بە کار بین تا بۆ شەڕی داهاتوو ئامادەیی باشترمان هەبێ!"

بەڵام پوورە مێشی گوتی: "بە داخەوە نابێ و ناکرێ. ئیتر هیچ سێومان نەماوە، چونکە بەهۆی شەڕەوە کەس بە دارسێوەکان ڕانەگەیوە. سێوەکان هەموویان لەسەر زەوی ترشاون. بۆ دروستکردنی کەیکیش ئارد مان نەماوە و بەو شێوەیە ناتوانین درێژە بە ژیان بدەین. ئەگەر ئاوا بچێتە پێش هەموومان لە برسان دەمرین. هیچ مانایەکی نییە کاتێ خواردەمەنییەك لە گۆڕێ دا نەبێ دزی لە یەکتر بکەین! ئەگەر ئێمە دەمانهەوێ خواردەمەنی تەواومان هەبێ، دەبێ هەر هەموومان تەواوی ڕۆژ خەریکی کارکردن و لێنان و دروست کردن بین. هەر وەکوو خەڵکی گوندی هەرمێش پێویستییان بە کارکردن هەیە. لە دزیکردن نە دار سێو شین دەبێ و نە دار هەرمێ. ئێمە دەبێ لەگەڵ گوندی هەرمێ ئاشت بینەوە!"

خەڵکی گوندەکە لەبەرئەوەی ئیتر شەڕ نەمێنێ و بتوانن خواردەمەنی دروست بکەن، دەنگی خۆیان دا بە پوورە مێشێ.

تەنیا ئاغای "شەڕ" زۆر تووڕە و ناڕازی بوو. چونکە ئەگەر شەڕ نەبێ، ناتوانێ دەستوور بدا و بەرپرسایەتی لە ئەستۆ بگرێت. دەسکەوتێکیش لە شەڕدەست نەدەکەوت کە بەشێکی زۆری بۆخۆی هەڵگرێ.

بەڵێ... ئاغای شەڕ سەری خۆی هەڵگرت و چووە گوندی پرتەقاڵ و بەوانی گوت: "باش گوێ ڕاگرن. خەڵکی گوندی هەرمێ بەهۆی شەڕەوە هیچ خوادەمەنییەکیان نەماوە. زۆر دوور نییە لە برسانە شاڵاو بێننە سەر ئێوە و لێتاندەن و دزیتان لێ بکەن.

خەڵکی گوندی پرتەقاڵ بە قامکێك پشت گوێچکەیان خوراند و گوتیان "ئێمە خۆ هیچ زیانێکمان بەوان نەگەیاندووە!"

"ئەوە شەرت نییە، ئەوان برسین و بۆیان گرنگ نییە" ئاغای "شەڕ" گوتی.

"زۆر ترسناك و جێی نگرانییە" خەڵکی گوندی پرتەقاڵ گوتیان. "ئەی ئێمە دەبێ چ بکەین؟" "ئێمە هیچ کاراییەکمان لە شەڕکردندا نییە."

"بەڵام ئێمە زۆر باشی لێ دەزانین!" ئاغای شەڕ گوتی. من پێشنیارێکم هەیە: بەوهۆیەی ئێمە لە گوندی خۆمان میوەمان زۆر نییە، چەند سەوەتەیەکمان پرتەقاڵ بدەنێ، ئێمەش کاتی هێرش هاوکارییتان دەکەین."

"دەی باشە"، بە نابەدڵییەوە خەڵکی گوندی پرتەقاڵ گوتیان. "هیچ ڕێگایەکیترمان بۆ نەماوەتەوە!"

ئاغای شەڕ گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیان و رووی کردە خەڵکی گوندەکە و گوتی: "ئەگەر هەر ئێستا خەریکی کارکردن بین، ساڵێك دەخایێنێت تا دارسێوەکانمان بەر بێنن. ئەدی چلۆن دەتانەوێ تا ساڵێکیتر ژیان بکەن؟ ئەگەر ئێمە ڕێگای ئاشتی بگرینە بەر، دەبێ تا ساڵیکیتر هەر برسی بین. بەڵام ئەگەر ئێمە لەگەڵ خەڵکی گوندی پرتەقاڵ بەرەیەك

ساز کەین بۆ بەربەرەکانی دژبە گوندی هەرمێ، دەتوانین هەر ئێستا پرتەقاڵمان بۆ خواردن هەبێ و مەجبوور نین ساڵێك برسێتی بکێشین."

"بەڵێ، ئاوا زۆر باشترە" لاوانی گوندەکە کە لە شەڕەکانی پێشوو ماندوویان حەسابۆوە، گوتیان. "ئێمە شەڕمان زۆر پێ باشترە هەتا چاندنی داری میوە."

خەڵکانی تری گوندەکەش بە قامکێك پشت سەریان خوراند و گوتیان: "ساڵێکی تەواو برسی بمێنین! کێ دەتوانێ ساڵێك خۆی برسی ڕابگرێ؟" بەوهۆیە زۆربەیان دەنگی خۆیان بە ئاغای "شەڕ" دا. تانیا لەو ناوەدا پوورە مێشێ سەری خۆی ڕادەوەشاند.

لەو ماوەیەدا کە خەڵکی گوندی سێو بە مەبەستی ڕێککەوتن لەگەڵ خەڵکی گوندی پرتەقاڵ دژ بە خەڵکی گوندی هەرمێ ، خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون ، خەڵکی هەرمێ و خەڵکی پرتەقاڵ ببوونە بەرەیەك و ڕێککەوتبوون. هەموو خەڵکەکانی تری ناوچەکەش دیواریان بە دەوری گوندەکانیان دا کێشابوو و تۆڕ و نەردیوان و قۆچەقانی و زۆر کەرەسەی تری شەڕیان بۆ پارێزگاری لە خۆیان ئامادە کردبوو. دوای ماوەی ساڵێك بە هۆی سەرقاڵ بوون بە تەوەری شەڕەوە و ئەوی کە وەك جاران ئیتر خەریکی ئامادەکردنی خواردەمەنی نەبوون، لە سەر هەموو گۆی خواردەمەنی، نە هیچ خواردەمەنییەک ما و نە هیچکەسیش ئیتر دزی دەکرد.

دوای ئەو کارەساتە پوورە مێشێ تەواوی ژنانی گوندەکانی گۆی خواردەمەنی لە جێگایەك کۆ کردەوە و پێی گوتن:

"ئا بەم شێوەیە ئیتر ناتوانین درێژە بەژیان بدەین. لە شەڕکردن و دزی کردن نە داری سێو شین دەبێ و نە داری هەرمێ و نە دارەکانیتر. بۆ درێژەدان بە ژیان و داهاتووی مناڵەکانمان هەر وەك لەهەموو

کۆمەڵگایەکدا باوە، دەبێ کەسانێک کاربکەن و خواردەمەنی ئامادە بکەن. لەبەر ئەوەی ئێمە دەبێ هەموومان کار بکەین بۆ بەڕێوەبردنی ژیانمان، ئیتر شەڕ کردن و دزی لەیەکتر کردن مانای نامێنێ. تۆڕ و قۆچەقانی و دیوار و کەل و پەلی شەڕ زگی ئێمە تێر ناکەن.

"گوتەکانت زۆر ڕاستن" ژنانی بەشدار لە کۆبوونەوەکە گوتیان.

"کە وابوو، بە پیاوەکانتان بڵێن، قۆڵی لێ هەڵماڵن و هەرچی زووتر بگەڕێنەوە بۆ ناو مەزراو باغ و جێگای کارەکانیان. دەنا بەو شێوەیە هەر هەمووومان لە برسانە دەمرین.

"بە چاوان" هەموو ژنەکان پێکەوە گوتیان.

بەڵێ... پیاوەکان دوای ئەوەی داوای لێ بوردنیان لە ژنەکان کرد، قۆڵیان لێ هەڵماڵی و دەستیان کردەوە بە کارکردن و گوتیان ئیتر ناهێڵین کارەساتی وا دووپات بێتەوە و ئاشتی و ئارامی گەڕایەوە سەر گۆی خواردەمەنی. دوای ماوەی دوو تا سێ ساڵ کارکردن، هەموو گوندەکان بە ڕادەی پێویست و زیاتر لە پێویستیش خواردەمەنییان هەبوو. خۆاردەمەنی هێندە زۆر ببوو کە ژنانی هەرکام لە گوندەکان کومپوت و مرەبا و کەیک و میوەی خۆیان بۆ گوندەکانیتریش دەنارد.

لەبەر ئەوەی ماوەیەکی زۆر ئاشتی و ئارامی گەڕابۆوە ناو گوندەکان و هەموو بەشدارانی کۆمەڵگا کاریان دەکرد، کاتێکی زۆریشیان بۆ دەماوە کە بیر لە چاکسازی ناو کۆمەڵگا و دروستکردن و دۆزینەوەی کەرەسە بۆ ژیانی باشتر بکەنەوە. بۆ وێنە کەرەسەی میوە لەدار کردنەوەیان دروست کرد کە ئیتر مەجبوور نەبن بە سەر دارەکاندا هەڵڕوسکێن. هەرچی کەرەسەی تازە دروست دەبوو، بەو ئەندازەیەش کاتی پیاسەکردنیان زیاتر دەبوو.

بەڵام رۆژێك لە ڕۆژان ئاغای "شەڕ" كە وا دیاربوو لەو ماوەیەدا زگی زۆر تێر ببوو، رووی كردە خەڵكی گوندی سێو و گوتی: "ئاوا نابێ، كە ئێمە بەهۆی ئەو كەرەسانەوە نیوەی رۆژ بێكار و تەوەزەل دابنیشین. ئەی چی بكەین، ئەگەر خەڵكی گوندی هەرمێ بەسەرماندا زاڵ بن و مەجبوورمان بكەن ئەو "نیوەڕۆژەمان" بۆ ئەوان كار بكەین؟ خەڵكی گوندی هەرمێ وەك من بزانم چەقۆیەكیان دروست كردووە كە بە راحەتی پێستی هەرمێ پاك دەكات. ئەوە جێی مەترسییەكی یەكجار گەورەیە، چونكە ئەگەر ئەوان لە داهاتوودا كاتیان زیاتر بێت، بەردەبنە دروستكردنی كەرەسەی شەڕ و خۆیانی پێ بە هێز دەكەن. كە وابوو ئێمەش ئەو نیوەڕۆژەی وا كارمان نییە نابێ خۆمان بە یاری كردن و خۆشگوزەرانی و گێڕانەوەی مەتەڵ و چیرۆك و مێژووەوە بخافڵێنین. ئێستا كاتمان هەیە كە خۆمان بە هێز بكەین و بۆ دواڕۆژ، خۆمانی پێ بپارێزین. ئێمە دەبێ هەموو كەرەسە مودێرنەكانمان هەبێ بۆ ئەوەی كەس نەوێرێ خۆمان لێبدات.

بەو گوتانەی ئاغای "شەڕ" هێندەی نەمابوو كە هەمیسان هەمووشتێك لە سەرڕاوە دەستپێبكرێتەوە، ئەگەر. ...

... ئەگەر پوورە مێشێ هەڵنەستابایە و لە دەمی ئاغای "شەڕ" ی نەدابایە. ئاغای "شەڕ" لە جێگای خۆی بە ئارامی دانیشت و دەمی خۆی بەست و ئیتر وشەیەكیشی لێ نەبیسترا.

# کاتێك سەربازەکان هاتن

**نووسەر: Martin Auer (مارتین ئاوەر)**

وەرگێران لە ئاڵمانییەوە: نادر فەتحی(شوانە)

کاتێك سەربازەکان هاتن، ئێمە خۆمان لە دەرەوە، لە ئەشکەوتێکی ناو بیاباندا شاردبۆوە. هەنبانەیەکی پڕ لە ئاوی لە پێستی بزن دروستکراو، چەند نان و چەند هەنجیرێکمان پێ بوو. ئەوە هەموو ئەو شتانە بوون کە لەگەڵ خۆمان بردبوومانن. دوو بزن مان هەبوو کە بەجێمان هێشتبوون. من زۆر خەمناك بووم، چونکە باوەگەورە گوتی: "پێموانییە ئیتر بزنەکانمان ببینینەوە. سەربازەکان دەیانکووژنەوە و دەیانخۆن." دایکم هێدی و لەسەر خۆ دەگریا، بەڵام بەو حاڵەشەوە شیری بە مناڵە چکوولەکەمان دەدا بۆ ئەوەی نەگری و شاراوگەکەمان لێ لەقاو نەدات. من دەمزانی نابێ بگریم، چونکە من ئیتر کیژۆڵەیەکی گەورە بووم و باوە گەورە پێی گوتبووم هەر وەك مرۆڤێکی گەورە لە هەمووشتێك تێدەگەم. من زۆر بە ئەسپایی لەگەڵ باوەگەورە دەدوام. لە پرێکدا باوەگەورە دەنگێکی لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە گوێ لێ بوو و دەبوایە منیش بێدەنگ بم بۆئەوەی باشتری گۆێ لێ بێت.

"بۆچی سەربازەکان دەبێ بزنەکانمان بکووژن"، من بە سەبرا پرسیارم لە باوە گەورە کرد. "ئەوان شیری بزنیان پێ خۆش نییە؟"

"بابەکەم، دیارە شیریان پێ خۆشە، بەڵام گۆشتیان پێ خۆشترە. چونکە پێموانییە سەربازەکان ئیزنی خواردنی بزنەکانی حەمە پاشایان هەبێت.

"مەگەر حەمە پاشا پاشای ئێمە نییە؟"

"بەڵێ، وا دەڵێن."

"ئەگەر بزنەکانمان لەگەڵ خۆمان هێنابایە، سەربازەکان نەیاندەتوانی بیانخۆن."

"ئەگەر بزنەکانمان لەگەڵ بایە، رەنگە جێی شاردنەوەکەمان لێ ئاشکرا بوایە. بەڵام پێموایە بۆ ئێمە هیچ جیاوازییەکی نەدەبوو بزنەکانمان لە لایەن سەربازەکانی حەمە پاشاوە بخورێن یا سەربازەکانی عەبە پاشاوە."

" ئەگەر عەبە پاشا ئەو شەڕە بباتەوە، سەربازەکانی ئەو ئێمە ناکووژن؟"

"نا ڕۆڵە گیان، تەنیا جیاوازی ئەوەیە، ئەگەر شەڕ کۆتایی بێ، و عەبە پاشا شەڕەکە بباتەوە لەجیاتی ئەوەی ماڵیات بە حەمە پاشا بدەین، دەبی ماڵیاتەکە بدەین بە عەبە پاشا."

"ئاخە باشە، مەگەر حەمە پاشا شای فەرمی و یاسایی خۆمان و باوکی وڵات نییە؟ مەگە ئەو باوکی هەمووومان نییە؟"

"بەڵێ ئەوان خۆیان وادەڵێن، بەڵام ئەوە قسەی کلیسایە. پێش ئەوەی حەمە پاشا ببێتە شای ئێمە، پاشایەکی دیکەمان بە ناوی خلە پاشا هەبوو و دەبوو هەمووومان بۆ سلامەتی ئەو لە کلیسا دۆعا بکەین. دواتر خلە پاشا و حەمە پاشا نێوان ناخۆشییان لێ پەیدابوو، چونکە خلە پاشا جنێوی نامووسی بە حەمە پاشا دابوو. شەڕێکی مەزن لە نێوانیاندا سەری هەڵدا و تیایدا سپای حەمە پاشا بەسەر سپای خلە پاشادا زاڵ بوو، خلە پاشا کوژراو و وڵاتەکەی لە لایەن حەمە پاشاوە داگیر کرا."

"مەگەر خلە پاشا سووکایەتی بە شەرافەتی حەمە پاشا نەکردبوو؟"

"بەڵی، وا دەڵێن."

"بابەگەورە، پێتوانییە حەمە پاشا مافی خۆی بووبێت بەرگری لە شەرافەتی خۆی بکات؟"

بەڵێ، لە ناو شایەکاندا وا باوە... وایە."

"باوه گەوره گیان تۆ لەسەر شەرافەتی خۆت بە شەڕ نایەیت؟"

"ئێمەی وەرزێر و زەحمەتکێش ڕێی ئەوەمان نییە بەرگری لەخۆمان بکەین. لەمڕۆ دا ئەوە تەنیا مافی ئەشراف و ئەعیانە و ئەگەر قەشەیەکی کلیسا بە هۆی نەدانی دانەوێڵە و باج لەکاتی خۆیدا، ناوەنیتکەی 'بەرازی تەمبەڵ' م پێبدات، ناتوانم لەخۆم بەرگری بکەم و ئەگەریش تەنیا هەوڵی ئەو کاره بدەم، دەتوانێ و ئیزنی ئەوەی هەیە دەستوور بدا کە تا ڕادەی مردن دارکاریم بکەن و بە قامچی لێم دەن. بەڵام بۆ شا ئەوە شتێکی ئاساییە کە لەسەر شەرافەتی خۆی هەزاران کەس بە کوشتن بدات."

"بۆچی شا مافی ئەوەی هەیە لەخۆی بەرگری بکات و وەرزێر کە ئەو هەموو زەحمەت و کوێرەوەرییە دەکێشێ، نا؟"

"ئاخ ڕۆلە گیان، شا دەسەڵاتی هەیە و لەشکری لەبەر دەست دایە و ئەگەر شایەکی تر سووکایەتی پێ بکات لەشکرەکەی دەنێرێتە سەر و شەڕی لەگەڵدا دەکات. جاری وا هەیە لەو شەڕەدا گیانی خۆی بەخت دەکات و جاری واش هەیە شایەکەی تر دەکووژرێ و وڵاتەکەی لە لایەن ئەمیانەوە زەوت دەکرێ و دەخرێتە سەر ناوچەی فەرمانڕەواییەکەی.

شا دۆڕاوەکە ئاگای لێ نابێ کە دەکرێ مرۆڤ بۆ بەرگری لە شەرافەتی گیانی بەخت بکات، چونکە ئەو ئیتر مردووە. شا سەرکەوتووەکەش بۆی دەبێتە ئەزموون کە بەرگری لە شەرافەت شتێکی باشە. کاتێك باوە گەورەی من گەنج بووە، لەو دۆڵە بچووکەی ئێمە ئەمڕۆ لێی دەژین نزیکەی سی شا فەرمانڕەواییان کردوە. ئێستا پێنجی گەوره حکوومەت دەکەن."

"چونکە شاکان شەڕیان لە نێواندا بووە؟ چۆنکە شەرافەتیان لە ژێر پرسیاردا بووە؟"

"بابەکەم، هەمیشە بیانوویەکی لەو چەشنانەیان بۆ شەڕ هەڵاییساندن هەبووە."

"ئەدی هەمیشە هەر ئاوا بووە؟ شەڕ هەمیشە هەر هەبووە، بۆ ئەوەی ناوچەی حوکمکردنیان گەورە و گەورەتر ببێتەوە؟"

"رۆڵە گیان، بە باشی نازانم"، باوە گەورە گوتی "باوە گەورەی من دەیگوت: زۆر لەمەوبەر و لە سەردەمی کۆندا، کۆمەڵگا شای نەبووە و هەمووان هەر وەرزێر و زەحمەتکێش بوون." ئەو دەیگوت، "هەموو خەڵک لە گوندی چکوولە و گەورەدا دەژیان و هیچ شتێکیان سەبارەت بە شەڕ نەدەزانی." من پێموایە ئەو قسانەی باوە گەورەم زۆر ڕاست بوون. لەبەر چی دەبوو خەڵکی لەگەڵ گوندی جیرانیان شەڕ بکەن؟ لەبەر چی دەبوو زەوی یەکتر داگیر بکەن؟ وەرزێر تەنیا پیویستی بە هێندە زەوی هەیە کە فریای کێڵان و چاندنی بکەوێ و خۆی و بنەماڵەکەی پێ بەخێوبکات. ئەوە جێی باوەڕە کە هیچ وەرزێرێک کاتی ئەوەی نییە لەسەر زەویەکی گەورە کار بکات کە نەتوانی کەڵك لە هەمووی وەربگرێ. رەنگە بە پێی کات بنەماڵەکان گەورەتر ببوونەوە و بە هۆی زۆر بوونی ئەندامانی بنەماڵەکان پێویستییان بە زەوی زۆرتر بووبێت، بەڵام بۆ ئەو کارە بڵێی هێرشیان بردبێتە سەر جیرانەکانیان و زەوییەکەیان زەوت کردبێ؟ من باوەڕ ناکەم.

من پیموایە لەجیاتی شەڕ کردن لەسەر زەوی و گیان لە مەترسی هاویشتن، زیاتر وابووە کە زەوییەکانیان بە دڵفرەوانییەوە لە نێوان خۆیاندا بەش کردووە. ئەگەریش شەڕیان لەسەر داگیر کردنی زەوی بووبێت دەبێ ئەو شەڕە زۆر زوو کۆتایی پێ هاتبێت، کاتێك زەوی کافییان بۆ کێڵان و چاندن هەبووبێ. تەماحی مرۆڤی ئەوزەمان زۆر نەبووە چونکە دەیانزانی کە تەنیا خۆیان دەبێ لەسەر زەوییەکە ئیش بکەن. بەڵام تەماحی شا کۆتایی نایەت."

"بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ وەرزێر، شا گیان لەبەرێکی ترە؟" من پرسیارم کرد، "رەنگە ئەوان چەشنە بوونەوەرێکی تر بن، وەك چۆن بزن مەڕ نییە؟"

"نا من باوەڕم بەوە نییە"، باوە گەورە گوتی، "ئەگەر تۆ کوڕی وەرزێرێك وەك شا گەورە بکەی و وەك شا ڕای بهێنی، هەموو ئەو کارانە دەکات کە شایەك دەیکا."

"باشە ئەی بۆچی شا جیاوازییان هەیە؟"

"چونکە شێوەی بەڕێوەچوونی ژیانیان جیاوازی هەیە؛ باوە گەورەم دەیگوت، کاتی زوو و زۆر کۆن هاوسەردەم لەگەڵ وەرزێر، ڕاوچیش هەبوون. ئەوانێش وەك وەرزێر لەسەر زەوی هیچ شەڕێکیان لەگەڵ یەکتر نەکردووە. هەرکام لەو گرووپە ڕاوچییانە جیگای تایبەتیی خۆیان بووە بۆ ڕاوکردن و هیچ پێویستییان بە جێگایەکی گەورە نەبووە.

بەڵام رۆژگارێک هاتووە کە بەرە بەرە کەش و هەوا ویشکتر بووە و لێرەوارەکان بچووکتر بوونەتەوە و ئاژەڵەکانی ناو لێرەواریش کەمتر بوونەتەوە. بەو بۆنەیەوە ڕاوچییەکان سەرنجیان بۆ ژیانی وەرزێری ڕاکشاوە، لە جێگایەکی تایبەت نیشتەجێ بوون و کەڵکیان لە ئاژەڵی ماڵی وەك بزن و مەڕ و بەراز وەرگرتووە و بە بێ ئەوەی کۆچ بکەن بژیوی ژیانیان لە دانەوێڵەی ساڵانە دابین کردوە. ڕاوچییەکان دەستیان بە دزی کردن و راو و رووتی وەرزێر کردوە و ئەگەر وەرزێرەکان بەرگرییان لێ بکردبایەن، دەکوژران چونکە ڕاوچییەکان کاری ڕۆژانەیان کوشتن بوو، باشتر دەیانتوانی لە چەك و چۆڵ کەڵك وەربگرن.

بەرە بەرە راوچییەکان بەو راستییەش گەیشتوون کە نابێ هەموو وەرزێرەکان لەناو بەرن دەنا هیچیان بۆ خواردن نامێنێ و لە برسان دەمرن. دوای ماوەیەك تاقمێك ژیر لە ناو ڕاوچییەکان هەڵکەوتوون کە لەگەڵ وەرزێرەکان پێك هاتوون و گوتوویانە: "ئەگەر ساڵانە بژیویان دابین بکرێ، لە هێرش بردنەسەری دزەکانی تر بۆ سەر ماڵ و گیانیان، پارێزگارییان لێ دەکەن." بەو شێوەیە ڕاوچییەکان بوونەتە هۆی پێکهاتنی شەڕکەر و شەڕکەرە زۆر بە جەرگەکانیش دەبوونە شای ناوچەکان.

خاوەن زەوی بوون بۆ شا، جیاوازتر بووە تا بۆ وەرزێر. شا خۆی لەسەر زەوی کارناکات و بۆ ئەو کارە وەرزێری هەیە کە شیر و ماست و گۆشت و کەرە و خوری و هەموو پێداویستییەکانی تری ژیانی دابین بکات. دیارە ئەو شتانە تەنیا بۆ شا نەبوون و بەشێکی بۆ سەربازەکان و پیاوە ئایینییەکانیش بووە کە پشتیوانیان لە شا دەکرد. بەشێکیش بۆ ئاسنگەرەکان بووە کە شمشیر و نیزە و کەرەسەی شەڕیان دروست کردووە. بەشێکیش بۆ ئەوانە بووە کە کاخ و سەرا و دیواری بەرزیان بۆ دروست کردوون. شا پێویستی بە تەواوی ئەوانە هەبوو بۆ ئەوەی وڵاتێکی زیاتری پێ داگیر بکات و ناوچەی فەرمانڕەواییەکەی پێ گەورەتر بکاتەوە."

"کە وابوو هیچ شەڕێك نەدەبوو ئەگەر شا نەبایە؟" من پرسیارم کرد.

"ئەگەر هیچ خەڵكێك نەبایە وەك زاروو ژیانیان لە کارکردنی خەڵکانیتر دابین کردبایە، ئەوکات شەڕکردن وەك ئەمڕۆ بێ کۆتایی نەدەبوو. ڕەنگە هیچ کاخ و قەڵایەکیش نەبوایە، چونکە بە هۆی ئاسایی بوونی خەڵکییەوە، کەس دروستکردنی شتی وای لە باری داراییەوە بۆ گونجاو نەدەبوو. ڕەنگە فەرشەکان کەمتر ڕەنگیان بایە و خەڵکی لەسەر زەوی رووت بخەوتبایەن و لێرە و لەوێ ناکۆکییەکی بچووك لە نێوان بەشدارانی کۆمەڵگادا هەبوایە، بەڵام ئەوانە بە ئەرخەیانییەوە زۆر زوو کۆتاییان پێ دەهات."

"کەوابوو شەڕ کردن هەرگیز کۆتایی نایە؟" من پرسیارم لە باوە گەورە کرد.

"ڕەنگە دوای هەزاران ساڵ، ئەو کاتەی تەواوی دنیا بووبێتە تەنیا ناوچەیەکی حوکمرانی."

"بەڵام ئەدی بۆچی ناتوانین وەك سەردەمەکانی پێشوو ژیان بکەین، ئەوکاتانەی وا شا نەبوون؟

"نا ئیتر ناتوانین وەك سەردەمی زوو بژین"، باوە گەورە گوتی. "شتی وا چۆن دەبێ؟ سەربازەکانی شا تا ژێر ددانیان بە چەك و کەرەسەی شەڕ تەیارکراوە و ئێمەش لە بەرانبەریان دا هیچمان نییە؟"

"بەڵام ئەگەر هەموو وەرزێرانی جیهان بێنە سەر ئەو باوەڕە کە ئیتر شا و سەربازەکانی بەخێو نەکەن چی؟"

"شتی وا نابێ"، باوە گەورە گوتی. "کێ دەتوانی برووسکە بۆ هەموو وەرزێرانی ئەم جیهانە بنێرێ و دژ بەو زارووانە یەکیان بکات ؟"

کاتێك سەربازەکان هەموویان کشابوونەوە، گوندەکە خاڵی ببوو. ئاژەڵەکان یا کووژرابوون یا لەگەڵ خۆیان بردبوویانن. هەموو دانەوێڵەکانیان سووتاندبوو. تەنانەت جەنجەڕ و گاسن و کەرەسەکانی کێڵانی زەویشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو. دواتر باوەگەورە پیشانی داین چلۆن لە چۆمی ماسی بگرین و لە کام گیا بۆ خواردن کەڵك وەرگرین. هەرچۆنێك بێت بەسەر ئەو ویشکساڵییەدا زاڵ بووین. کاتێك باران باری، دەشت و زەوی ژیانەوە و ئەو دانەوێڵانەی ساڵی پێشوو کاتی خەرمان کەوتبوونە سەر زەوی هەمیسان شین بوونەوە. بەرە بەرە زەوی و ژیانمان ژیاندەوە. دایکم مرد و دواتریش باوە گەورە بەجێی هێشتین. برا چکوولەکەشم لەگەڵ کچێکی گوندی جیران گوندەکەمان زەماوەندی کرد و منداڵێکیان بوو.

رۆژێك لە ڕۆژان سەربازەکان دیسان هاتنەوە.

